

**نووسینی: بەکر بیچەر**
**مامۆستا لە بەشی مێژووی فاکەڵتی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی لە زانکۆی قۆنیا.**

**وەرگێڕانی لە تورکییەوە: حەمزە محەمەد ساڵح**

# کورد و کوردستان

## لە کتێبەکانی وانەی جوگرافیای دەوڵەتی عوسمانیدا[1]

١ ئەوەی لەم نووسینەدا خراوەتە ڕوو بۆچوونی نووسەرە و مەرج نییە لەگەڵ هەموو بۆچوونەکانیدا بین، ئێمە تەنها وەک ئەمانەتێکی زانستی بابەتەکەمان وەک خۆی وەرگێڕاوە. (وەرگێڕ)

لە كۆتا ساتەكانی دەوڵەتی عوسمانیدا دەگوترا: "تەنها پەروەردە و مامۆستایان دەتوانن دەوڵەتی عوسمانی لە دارمان ڕزگار بكەن". هەر لەبەر ئەم هۆیە گرنگییەكی زۆر بە بواری پەروەردە و فێركردن درا. بەردەوام دەوڵەتی عوسمانی لە شەڕەكاندا تووشی شكست و لاوازی دەبوو، هەروەك بڵێیت هیچ نەبووبێت و تازە ڕزگاری بووبێت، نزیكەی دووسەد كتێب لە بواری جوگرافیای عوسمانی نووسرا. ئەو خاكانەش لە دەستی دابوون لەم كتێبانەدا لە بیر نەكراون و چەندین دەستەواژەی وەك وەكوو: پێشتر ئەم خاكانە هی ئێمە بووە، بە كاتی وازیان لێ هێنراوە، بەڵام وەریدەگیرێنەوە، ئێستا داگیر كراون بەكارهێنراوە.

بەپێی ڕای توێژەران ئەوەی خاكەكانی دەوڵەتی عوسمانی پێكەوە دەبەستەوە، بریتی بوو لە ڕاستگۆیی بەرامبەر پادشا. چونكە خاك موڵكی پادشایە. دەوڵەتی عوسمانی ناوی ڕەسمی بریتی بوو لە دەوڵەتی عالی عوسمانی. خاكی ئەم دەوڵەتەش چەندین ناوی هەبوو، وەك مەملەكەتی عوسمانی، مەملەكەتی شاهانە. ناوچەی ئانادۆڵیش بە ئانادۆڵی شاهانە ناودەبرا. واتە دەوڵەتی عوسمانی لەكاتی ناونانی وڵاتێك و ناوچەیەكدا یاخود دروستكردنی ویلایەتێكدا ناوێكی مەركەزی عوسمانیان هەڵدەبژارد. واتە لە ناوچەكاندا بەپێی ڕەگەزی نەتەوەیی و بونیادی سیاسی ناو نەدەنرا.

لە سەدەی نۆزدە لە میسر كتێبێك بە زمانی عەرەبی چاپكرا و ناوی توركیاش برا. لە سەدەی بیست بەدواوە ناوی توركیا زیاتر لە كتێبە جوگرافییەكاندا دەبینرا. ئەمیش چەند نووسەرێكی كەم ئەم ناویانە بەكارهێناوە. تەنانەت لە سەرەتاكانی كۆماری نوێی توركیادا ناوی توركیا بەكارنەدەهێنرا.

نووسەران لە كتێبەكانیاندا دوای حەمدی خودا و سەڵاواتدان لە پێغەمبەر، دوعایان بۆ پاشا كردووە و سوپاسیان كردووە. لە كتێبەكانی جوگرافیادا دوای خستنەڕووی زانیاری لەسەر ئەوەی جوگرافیا چییە، جۆرەكانی جوگرافیا چین، بابەتەكانی جوگرافیا چین، شێوەی دونیا چۆنە، جولە جوگرافییەكان چین، كیشوەرەكان، ئۆقیانووسەكان و وەرزەكان، ئینجا چوونەتە سەر بابەتی جوگرافیای عوسمانی. بەشێوەیەكی گشتی جوگرافیای عوسمانیان كردووە بە سێ بەشەوە.

عوسمانی ئەورووپا، ئاسیا و ئەفریقا.

شێوەی نووسینی کتێبەکان دوای نووسینی ناوەڕۆک، سەرەتا و کۆتایی بابەتەکان جیاوازە. واتە ئەو ڕێسایەی پێویست بووە لە شێوەی نووسینی کتێبەکەدا هەبێت نەبووە. هەر نووسەرە بەپێی توانا و ئاستی زانیارییەکانی خۆی کتێبی نووسیووە. زمانی نووسینەکان بەپێی سەردەمەکە زۆر سادە و ڕوون نووسراوون. واتە دەزگایەک نەبووە کۆنترۆڵی زانیارییەکان بکات. هەندێک نووسەر بێ ئەوەی ناوی سەرچاوە ببات بەرهەمێکی ڕۆژئاوای هێناوە و وەریگێڕاوە. هەندێکیان ناوی شوێنەکانی بە فەرەنسی و تورکی نووسیوە. هەندێک نووسەریش کاتێک زانیارییەکانی خستووەتە ڕوو هەستی بەوە نەکردووە کە ناوی سەرچاوە بهێنێت. زۆر کاتیش لە هەمان کتێبدا زانیاری دووبارەی داوە. هۆکاری ئەمانە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە زانیاری تەواو نەبووە لەسەر ڕێژەی دانیشتووان، تاوەکوو ئەو سەردەمە زانستی ئامار لە دایک نەببوو. هەربۆیە زۆرینەی زانیارییەکان لەسەر ڕێژەی دانیشتووانی دەوڵەتی عوسمانی بە خەمڵاندن بووە.

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ویستوویەتی لە ڕێگەی ئەم کتێبانەوە ئامانج و مەبەستەکانی بە باشترین شێوە بگوازێتەوە بۆ نەوەی نوێ. دەوڵەتی عوسمانی لە باسکردنی ڕیشەی نەتەوەیی خەڵکی، ئایینەکان، کولتوور و نیشتمانی خەڵکەکە زۆر لای ئاسایی بووە. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ جۆرە هەوڵێک نابینرێت بۆ بەلاڕێدا بردن و ئینکاریی مێژوو و شوناسی نەتەوەیی. هەربۆیە لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا هەر نەتەوە و ئاینێک هەبووبێت، لەنێو کتێبی قوتابخانەکان باسکراوە. بۆ نموونە ئەو ناوچەیەی لازەکانی لێ ژیاوە بە لازیستان، ئەو ناوچەیەی تەتەرەکانی لێ ژیاوە بە تەتەرستان و ئەو ناوچەیەی کوردەکانی لێ ژیاوە بە کوردستان ناوبراوە. لەگەڵ ئەمانەشدا نووسەران بەپێی تێگەیشتن و زانیارییەکانی خۆیان جوگرافیای عوسمانیان باس کردووە. واتە پێوەرێکی ستاندارد نەبووە لە ناونانی ناوچە و شوێنە جوگرافییەکان. بۆ نموونە ئەو ناوچەیەی زۆرینەی کورد بووە لە کتێبە جوگرافییەکاندا هەندێکیان بە ئەنادۆڵ، هەندێکیان ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ یان بە ڕووباری فورات و ئەو لای ڕووباری فوراتیش بە کوردستان ناونراوە.

کورد و کوردستان لە کتێبەکانی وانەی جوگرافیای دەوڵەتی عوسمانیدا

ئەگەر بەوردی ئەو زانیارییانەی لەناو کتێبەکانی جوگرافیادا دراون بخوێنرێتەوە،

ئەوە دەردەکەوێت نووسەرانی کتێبی جوگرافیا سەبارەت بە نیشتمانی کوردەکان دەبن بە سێ بەشەوە:

**یەکەم**: هەندێک لە نووسەران کوردەکانیان تەنها وەکو یەکێک لە پێکهێنەرەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی باس کردووە. بەشێوەیەکی گشتی پێکهێنەرەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیان بەم شێوە ڕیز کردووە: تورک، عەرەب، کورد، ئەلبانی، بۆشناک، ئەرمەن، تەتەر، ڕووم و یەهوودی.

**دووەم**: هەندێک لە جوگرافیناسان لە شوێنی ناوی کوردستان ئەلجەزیرە و جەزیرەی عولیایان بەکارهێناوە. سەبارەت بەو کوردانەی لەم ناوچەدا دەژین زانیارییەکی زۆر کەمیان داوە. تەنها دەڵێن کوردەکان لە ناوچە شاخاوییەکاندا دەژین. زۆر میوان دۆستن. جەنگاوەر و چاونەترسن.

**سێیەم**: هەندێک لە نووسەران کاتێک باسیان لە ئاسیای عوسمانی کردووە، مەبەستیان مەرکەزی ئەنادۆڵ بووە. کاتێکیش سنووری ئەنادۆڵیان دیاری کردووە، پێوانەی ڕووباری فوراتیان کردووە. بە ئەو لای فوراتیان وتووە کوردستان، واتە باکووری عێراق و ئەو ناوچانەی لە ئەنادۆڵدا کوردەکانی لێ ژیاوە. کوردستانیان کردووە بە دوو بەشەوە کوردستانی عوسمانی و کوردستانی ئێران.

ئێستا با بزانین جوگرافیناسانی عوسمانی کاتێک ناوی کوردستانیان هێناوە، سەبارەت بە کوردەکان چی زانیارییەکیان داوە، کوردەکان لە کام ناوچەدا دەژین و ڕێژەی دانیشتوانیان چەندە. ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ئاسیای عوسمانی دابەشی کردبوو بۆ ژمارەیەک ویلایەت و ئەلایەت و ئەو سەنجاقەکانەی سەر بە ئەلایەتەکان بەردەوام گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە. کوردستان وەکو ویلایەتێک ئاماژەی بۆ کراوە. ئەو مەرکەز، سەنجاق و قەزانەی لەخۆی گرتبوو، دەتوانین بەم شێوە ڕیزیان بکەین:

**ویلایەتی ئەرزڕووم**: جگەلەوەی مەرکەزەکەی ئەرزڕووم بووە، چەند سەنجاق و قەزایەکیشی هەبووە، وەک (پاسیننەکان، بایازید (ئاگری)، ئەرزنجان، بایبورت، کغی... تاد.

**ویلایەتی وان**: چاتاک، گەڤاش، عادیل جەواز، ئێرجیش، بارگیری، موکس.

**ویلایەتی بەدلیس**: سیرت، مووش، ئەخلات، هیزان، موتکی، مەلازگەرد، ڤارتۆ، ساسۆن، هازرۆ، گارزان، شیروان، ئەروح، پەرواری، چاپاکچوور، گەنج، کوڵپ ... تاد.

**ویلایەتی دەرسیم**: هۆزات، مازگیرت.

**ویلایەتی مەعمورەتولعەزیز (ئەلازیغ):** هابووت، ئەین، عەرەبگیر، مەڵاتییە، کاهتا، ئادیامان ... تاد.

**ویلایەتی دیاربەکر:** پاڵو، ئەرگانی، ماردین، جەزیرە، سیلڤان، لیجە، دەریک، نویەیبین، میدیات، شەرناخ، سیڤەرەک ... تاد.

**ویلایەتی هەکاری:** مەرکەزی ئیدارەکە ئەلباقە یاخود باشقەڵا. شاری بەناوبانگی جولەمێرگ و عیمادییە(ئامێدی)یە.

**ویلایەتی موسڵ:** ناوچەکانی شارەزوور، ئەربیل، کەرکوک، سلێمانی، ئاکرێ، دهۆک، زاخۆ، سینجار، عیمادییە (ئامێدی)(١)، ڕەواندز، کۆیە، ڕانیە ... لەخۆدەگرێت.

**ویلایەتی حەلەب:** ناوچەکانی کلیس، عەنتاب، ئورفە و ئەنتاکیا لەخۆدەگرێت.

ئیمپراتۆری عوسمانی لەساڵی ١٨٤١دا ئەلایەتی کوردستانی دروست کرد. بابەتێکی گرنگە هەیە، ئەویش ئەوەیە لە سەردەمی عوسمانییەکاندا کوردستان بەمانای ناوچەیەکی نەتەوەیی و نیشتمانی کوردەکان نەهاتووە. لەگەڵ ئەوەشدا لە سەردەمی عوسمانییەکاندا ئەو ویلایەت، ئیلایەت و ناوچەیەکی جوگرافی کە بە کوردستان دانراوە، بە مانای ئەوە نەهاتووە دانیشتوانەکەی هەموو لە کورد پێکهاتبێت. بەڵکوو کوردستان بە ناوچەیەک وتراو و دابەشکردنێکی کارگێڕی عوسمانی بووە.

بابەتێکی تری گرنگ ئەوەیە، لە سەردەمی عوسمانییەکاندا میللەت بە مانا ئایینییەکەی بە کارهێنراوە. لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا خەڵک بە مسوڵمان و نا مسوڵمان وتراوە. هەربۆیە دیاریکردنی ڕێژەی تورک، کورد و عەرەب زەحمەتە. یەکێک لەو هەڵانەی لەم بوارەدا دەکرێت بریتییە لە قسەکردن لەسەر کوردەکان بەبێ گەڕانەوە بۆ ڕاستییە مێژووییەکان. لەگەڵ ئەوەشدا هەڵەیەکی دیکە بریتییە لە گشتاندن بۆ ڕێژەی دانیشتووانی ناوچە کوردییەکان. لەکاتێکدا زۆرینەی ئەو ناوچانەی کوردی لێیە دوای چۆڵکردنی ئەرمەنییەکان بووە. زۆرینەی ئەو ئەرمەنییانەی بەهۆی جەنگەکانەوە بەرەو ئەرمەنستان کۆچیان کرد کوردەکان لە شوێنەکانیان نیشتەجێ بوون.(٢) هەربۆیە جگە لە شاری سلێمانی هیچ

١ وادیارە (عیمادییە یان ئامێدی) لە ئاڵوگۆڕە کارگێڕییەکاندا هەندێ جار سەر بە هەکاری بووە و هەندێ جاریش سەر بە موسڵ.

٢ لەکۆتایی حوکمی عوسمانیی و زیاتریش دوای دروستبوونی تورکیای کۆماری، تورکەکان هەموو میکانیزمێکیان گرتەبەر بۆ سڕینەوەی کورد و شوناسی کوردی لەو وڵاتە، هەتا گەیشت

شارێکی دیکەی کوردی دامەزرێنەرەکەی کورد نییە، بەڵکوو لەلایەن کەسانی دیکەوە دروستکراوە و دواتر کوردەکان هاتوون تێیدا نیشتەجێ بوون.(٣) ڕێژەی دانیشتوانی کوردەکان دوای هاتنیان بۆ نێو شارەکان زۆر بەخێرایی زیادی کردووە. بە تایبەت لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە گەشەسەندنێکی خێرا لە ڕێژەی کوردەکان و بڵاوبوونەیاندا دەبینرێت.

دوای دامەزراندنی کۆماری تورکیا، ناوی کوردستان لە کتێبی وانەکانی قوتابخانەدا بەشێوەیەکی قۆناغبەندی بەکارهێنراوە. بەڵام دوای ماوەیەی کەم لە

---

بەوەی کوردیان بە تورکی چیایی لەقەڵەمدا، واتە هەر لە بنەڕەتەوە ئینکاری بوونی کوردیان لەو وڵاتە کرد. لەو مێژووەوە هەر شتێک پەیوەندی بە کوردەوە هەبووبێت هەوڵی سڕینەوەیان داوە، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندی بە مێژوو و جوگرافیای کوردستان و کولتووری کۆمەڵگەی کوردییەوە هەبێت. لە دوای ساڵی ١٩١٤شەوە چیتر ناوی کوردستان بۆ هەموو یان بەشێکی خاکی کوردستان بەکارنەبرا وەک ئەوەی لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا بەدەیان بەڵگەی مێژوویی لەسەرە، بەڵکو لەوە بەدوا دەستەواژەی باشووری ڕۆژهەڵات شوێنی ناوی کوردستانی گرتەوە. هەربۆیە سرووشتییە نووسەران بەهۆی سیاسەتی وڵاتەکەیانەوە بەمەبەست بووبێ یان بێ مەبەست لەبارەی کورد و کوردستانەوە کەوتبنە زۆر هەڵەی مێژووییەوە، لەنێویاندا ئینکاریکردنی بوونی کورد و ناوهێنانی بەشێک لە خاکەکەی بەناوی میللەتان و نەتەوەکانی ترەوە، وەک ئەوەی لەم چەند دێڕەی سەرەوە بەرچاومان دەکەوێت. (وەرگێڕ)

٣ بابەتی دروستکردنی شارە کوردییەکان بەوشێوەیە نییە کە لێرەدا باسکراوە، سەرچاوە و بەڵگەنامە مێژووییەکان ڕوونی دەکەنەوە کە کورد هەزاران ساڵە لەسەر خاکی خۆی بەبێ دەستدرێژی بۆ سەر دراوسێکانی ژیاوە، ڕاستە خەڵکی دیکەی لەگەڵ ژیاوە، بەڵام ئەو جوگرافیایەی کە کوردی لەسەر ژیاوە بە کوردستان ناوبراوە، کەی و کێ ئەو شارانەی دروستکردووە لە بایەخی ئەوە کەمناکاتەوە کە خاکەکە کوردستان بووە. جگەلەوەش هەندێک لەو شارانە تەمەنیان هەزاران ساڵە یان مێژووەکەیان هێندە کۆنە نازانرێت مێژووی دروستکردنی ئەو شارانە بۆ کەی دەگەڕێتەوە، چ جای ئەوەی بزانرێت کێ دروستیکردووە. ئەوە شتێک نیەي تایبەت بێت بە کورد و کوردستان، گەلان و نەتەوەکانی تری دونیاش هەمان کێشەیان سەبارەت بە مێژووی دروستکردنی شارە کۆنەکانیان هەیە، بەڵام ئەوە لە بایەخی ئەوە کەمناکاتەوە کە ئەو شارانە لە قوڵایی خاکی کوردستاندا دروستکراون. هۆکاری مانەوەی کوردیش لەسەر خاکەکەی سەرەڕای ئەو هەموو شەڕ وماڵوێرانییەی کە لەسەر خاکەکەی ڕوویداوە و ئەو هەموو شەپۆلە مرۆییەی کە ڕووی لە وڵاتەکەی کردووە ئەوەبووە کە کورد خاکەکەی بە موڵکی خۆی زانیوە، هەربۆیە بەرگەی هەموو ئەو نەهامەتیی و وێرانکارییانەی گرتووە کە بەسەریدا هاتووە و لێی هەڵنەهاتووە، بەڵام ئەوانی دیکە لەبەرئەوەی لە دەرەوە هاتوون و خاکەکەیان بە هی خۆیان نەزانیوە، ئەگەر ماوەیەکیش دەوڵەت یان میرنشینیان لەسەر خاکی کوردستان یان بەشێکی دروستکردبێت لەگەڵ ئاوابوونی خۆری دەسەڵاتیاندا وەک نەتەوەیەکی خاوەن جوگرافیا لە کوردستان نەماونەتەوە و بەتێپەڕبوونی کات شوێنەواریان نەماوە و سڕاوەتەوە. (وەرگێڕ)

شوێنی کوردستان وشەی جەزیرەی سەرەوە بەکارهێنراوە. لە سەردەمی ئێستادا بە شێوەیەکی گشتی ئەنادۆڵ و ئەو ناوچانەی کوردی لێ دەژی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئانادۆڵ بەکاردەهێنرێت. یەکێکی دیکە لەو بابەتە گرنگانەی پێویستە ئاماژەی پێ بدرێت، بریتییە لەوەی وشەی کوردستان لەناو کتێبە جوگرافییەکانی سەردەمی عوسمانیدا جا بەهەر بارێکدا بەکارهێنرابێت زۆر بە ئاسانی و بەبێ هیچ گرفتێک بەکارهێنراوە. بەڵام لە دوای دامەزراندنی کۆماری نوێی تورکیاوە وردە وردە ئەم وشەیە بە گرفت دەزانرێت و سڵ لە بەکارهینانی دەکرێت تەنانەت تا ئاستی قەدەغەکردنی.

لەم توێژینەوەدا تیشک خراوەتە سەر ئەو زانیارییانەی لەناو کتێبەکانی جوگرافیادا سەبارەت بە کورد و کوردستان هەیە. سەرەتا دەبێت ئەوە بڵێین کە تەنها لەناو ئەم کتیبانەدا بەشی تایبەت دانراوە بۆ کورد و کوردستان. هەربۆیە لەم توێژینەوەدا وەڵامی پرسیارەکانی وەکوو جوگرافیای کوردستان تا کوێ قبوڵ کراوە؟ ناوی کوردستان بۆ کوێ و بەچی مانایەک بەکارهێنراوە؟ بۆچوون و قەناعەتی نووسەران سەبارەت بە کوردەکان چییە؟ کوردستان لە یەکێتی دەوڵەتی عوسمانیدا چ ڕۆڵێکی بینیووە؟ دراوەتەوە. بەتایبەت بەدوای وەڵامی ئەو پرسیارەدا گەڕاوە کە نووسەری کتێبەکانی وانەی جوگرافیا وشەی کوردستانیان تاوەکوو کوێ و بەچی مانایەک بەکار هێناوە. هەربۆیە ئەگەر وەڵامی ئەم پرسیارە بە ڕاستی بدۆزرێتەوە، ئەوا گفتوگۆکان لە بابەتی بەکارهێنانی خراپی ناوی کوردستان دەچنە دەرەوە و قسەکردن لەسەر کێشە هەنوکەییەکان ئاسانتر دەبێت. دوای ئەم پێشەکییە ئیتر دەتوانین باس لەو زانیارییانە بکەین کە لە کتێبەکانی جوگرافیای قوتابخانەدا سەبارەت بە کورد و کوردستان هاتووە. ئەو کتێبانەی ئاماژەی بۆ وشەی کورد و کوردستان کردووە ڕێژەیان زۆرە، بەڵام ئێمە لە خوارەوە بە کورتی باس لە هەندێک لەو کتێبانە دەکەین.

**ئەحمەد ڕیفات ئەفەندی، لوغاتی تاریخ و جوگرافیا، ئیستەنبوڵ، ١٨٨١.**

لە لاپەڕە ٧٧ی کتێبەکەدا بەم شێوە باسی کورد و کوردستان کراوە: کورد یەکێکە لە نەتەوەکانی ئاسیا، دەکەونە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە، شاخەکانی واقی، وان و دەریاچەی ئورمێ. بەپێی ناوەکەی خۆیان ناوی (کوردستان)یان لێ نراوە. ئەمانە جگەلەوەی خێرا و ئازان، بەردەوام بە ئازادی ژیاون. زۆرینەیان مەزهەبیان سوننەیە، هەندێکیان شیعە و نەستوورین. گومان دەکرێت ئەمانە

له کۆندا له کلدان و پارتەکان بووبن. له هەمان لاپەڕەدا دەڵێت: کوردستانی عوسمانی دەکەوێته نێوان ئەرمەنستان، جەزیرە، عەرەبی عێراق و عەجەمستان. که پێکهاتوون له ویلایەتی شارەزوور و موسڵ لەگەڵ بەشێکی ویلایەتی بەغدا. وا دەخەملێنرێت ژمارەیان ٣٥٠ هەزار کەس بێت. خەڵکەکه هەرچەنده زۆرینەیان نەزانن و لەناو نەزانیی و ژیانی کۆچەریدا دەژین، بەڵام خەڵکانێکی ئازا، قەناعەتکار و میوان دۆستن. له لاپەڕە ٧٨یشدا دەڵێت: کوردستانی عەجەم ویلایەتێکه له نێوان ئازەربایجان له عەجەمستاندا، عێراقی عەجەم، خوزیزتان و کوردستانی عوسمانی. ژمارەی دانیشتووانی ٤٠٠ هەزار کەسه و پایتەختەکەشی کرمانشاهه.

**حوسەین حوسنوو، ئیجمالی جوگرافیا (مەعلووماتی عومومییە)، ئیستەنبوڵ، ١٨٨٢.**

له لاپەڕە ١٥٨ نووسراوە: بەشی ئاسیای عوسمانی که پێی دەوترێت ئەنادۆڵ یان ئاسیای بچووک، بەشێکی زۆری کوردستان لەگەڵ سوریا، جەزیرە و عێراق لەخۆدەگرێت و تاوەکوو ئێران درێژدەبێتەوە. ژمارەی دانیشتووانی ئاسیای عوسمانی ١٦,٥٠٠,٠٠٠ کەسه. خەڵکەکەی له تورک، عەرەب، کورد، لاز، چەرکەز، کلدانی، یەهوودی، چینگەنه (قەرەچ) پێکهاتووە.

ئەحمەد حەمدی، ئوسوڵی جوگرافیایی سائیر، ئیستەنبوڵ، ١٨٨٣.

له لاپەڕەی ١٤٨دا دەڵێت: ویلایەتی دەرسیم، له ڕۆژهەڵات و باکووری به ویلایەتی ئەرزڕوم، له ڕۆژئاوا و باشوورییەوە به ویلایەتی مەعمورەتولعەزیز (ئەلازیغ) دەورە دراوە و به سەنجاقەکانی دەرسیم و مازگریت ناسراوە. شانشینی کوردستان که تازە دروست بوون، بەپێی هەڵکەوتەی شوێنەکەی گرنگییەکی زۆری هەیە. قەزای هۆزات که مەرکەزی ئیدارەکەیه ژمارەی دانیشتووانی ١٥,٠٠٠ کەسه.

خوسرەو، تیجارەتی جوگرافیای مەمالیکی عوسمانی، ئیستەنبوڵ، ١٨٨٤.

له لاپەڕە ٧ی کتێبەکەدا دەڵێت: بەشێوەیەکی گشتی ڕووبەری خاکی دەوڵەتی عوسمانی ٥,٤٨٩,٠٠٠ کم. ژمارەی دانیشتووانی ٤٩,٠٠٠,٠٠٠ کەسه. لەم ژمارەیه نیوەی تورکە، ئەوی تری له عەرەب، ئەرمەن، ڕووم، بولگار، یەهوودی، سریانی، کلدانی، کورد، ئەلبانی، لاز، چەرکەز، گورجی و تەتەر پێکهاتووە.

ژان لاپێر، موختەصەری جوگرافیای عوسمانی، قوستەنتینیە، ١٨٨٦.

له لاپەڕە ٣٢ دا دەڵێت: له ڕوانگەی مێژووییەوە ئاسیای عوسمانی دابەش دەبێت بۆ شەش بەش: ئاسیای بچووک، کوردستان، جەزیرە، عەرەبی عێراق،

سووریا، عەرەبستان. دواتر لە لاپەڕە ٣٨دا دەڵێت: کوردستان بەشێوەیەکی گشتی ناوچەیەکی شاخاوییە. زۆرینەی شاخەکانیشی لووتکە بەرزن. لە داوێنی شاخەکاندا لەوەڕگایەکی فراوان هەیە، کە ژمارەیەکی بێ سنوور ئاژەڵداری لێیە.

**عەلی سایب، جوگرافیای موفەصەل، مەملەکەتی دەوڵەتی عوسمانی، قوستەنتینیە، ١٨٨٦.**

لە لاپەڕە ٢٠٤ دا دەڵێت: لە ئاسیای بچووک ئەوەی باڵادەستە یەکتاپەرستانی ئیسلامن (خودا ژمارەیان زیاد بکات) و مەزهەبیان حەنەفییە. لەنێو ئەم کیشوەرەدا، هەندێک کوردی شیعەی تێدایە، کە کۆچەرین. ویلایەتی ئەرزڕووم، لەگەڵ بەشێک لە ئاسیای بچووک کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵی شاهانە و بەشێکی لەسەرەوە بریتییە لە کوردستان. لە لاپەڕە ٣٦١ ناونیشانێکی داناوە بەناوی (جەزیرە، ئاسورییە و کوردستان) و دەڵێت: ویلایەتی دیاربەکر پارچەیەکە لە کوردستان. دیاربەکر ناوی کۆنی ئامەد بووە، بەڵام دواتر گۆڕاوە بۆ دیاربەکر. لە لاپەڕە ٣٦٢یشدا دەڵێت: لەناو کوردەکاندا ڕێکەوتن نەبووە، بەڵکوو بەردەوام نیفاق هەبووە. هەر کۆمەڵێک لە سنوورەکەی خۆیدا متمانەی بەخۆی کردووە و سەری شۆڕنەکردووە بۆ ئەوانەی دیکە. سەبارەت بە ئایینی کوردەکان لە لاپەڕە ٣٦٢ دەڵێت: زۆرینەی کوردەکان ئەهلی سوننەن و دیندارن. تەنها کەمێکیان نەبێت کە لە سەردەمی دەوڵەتی ئەمەوییەکاندا چوونە شام و لەوێ ئایینیان بۆ مەزهەبێکی سەیر گۆڕی، کە هەندێکیان گەڕانەوە بۆ ناو ئیسلام، هەندێکی دیکەیان هێشتا لەسەر ئەو مەزهەبە سەیرەی خۆیان ماون. ئەوانیش پێیان دەوترێت یەزیدی. ئەمانە بە زۆری لە قەزای شەنگالی سەر بە ویلایەتی موسڵ نیشتەجێن.

**ڕەشاد، کیتابول درووس جوگرافیا، چاپی یەکەم. بولاک، میسر، ١٨٨٩.**

لە لاپەڕە ٩٣ دەڵێت: بەشی ئاسیای دەوڵەتی عوسمانی دابەش دەبێت بۆ ١٩ ویلایەت. ٧ ویلایەتیان لە ئەنادۆڵدایە. ئەوانیش بریتین لە ئەرمینیا، بەدلیس، مەعمورەتولعەزیز (ئەلازیغ)، کوردستان، دیاربەکر، موسڵ. لە لاپەڕە ٩٦دا باس لە چەند ناوچەیەکی دەوڵەتی عوسمانی دەکات. لەم سێ خاڵەدا باسی لە کورد و کوردستان کردووە:

١- ئاسیای بچووک: عەرەبەکان بە ئەنادۆڵ دەڵێن (بیلاد روم). سنوورەکەشی بە دەریای ڕەش، گەرووەکان، ئەرمەنییە، شاخەکانی کورد، شام و لە ڕۆژئاواوە بە ئەنادۆڵ دەور دراوە.

٢- ئەرمەنستانی عوسمانی، بریتییە لە نیوەی ئەرمەنی کۆن. سنوورەکەشی بە دەریای ڕەش، بەلەدەکانی چەرکەز، بەلەدەکانی فارس، لە باشوورەوە بە شاخەکانی کورد، لە ڕۆژئاواشەوە بە ئەنادۆڵ دەور دراوە.

٣- کوردستان، لە باکوورەوە بە ئەرمەنستان، لە ڕۆژهەڵاتەوە بە ئێران، لە باشوورەوە بە جەزیرە، شام و ئەنادۆڵ دەور دراوە.

**ئەحمەد جەمال، جوگرافیای عوسمانی، ئیستەنبوڵ، ١٨٩٣.**

لە لاپەڕە ٩٣ دەڵێت: خاکی عوسمانی دەبێت بە سێ بەشەوە: ئەورووپای عوسمانی، ئاسیای عوسمانی (ویلایەتی شاهانە لە قارەی کوردستان)، ئەفریقای عوسمانی. ئاسیای عوسمانی پێکهاتووە لە شەش ناوچەی گەورەی وەک ئانادۆڵ، کوردستان، جەزیرە- عێراق و ئەقسا، دوورگەکان، حیجاز- یەمەن، سووریا- فەلەستین. هەریەکە لەم ناوچانەش کۆمەڵێک ویلایەتی لەخۆگرتووە. کوردستان بەو ناوچە دەوترێت لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵەوە تاوەکوو سنووری عەجەمستان درێژ دەبێتەوە.

لە لاپەڕە ١٤٤یشدا دەڵێت: زۆرینەی خەڵکی دیاربەکر بە تورکی قسە دەکەن، هەندێکیان بە کوردی و عەرەبی قسە دەکەن. خەڵکی دەرەوەی شار هەمووی کوردن. لە لاپەڕە ٢٣٤ تا وەکوو ٢٣٧ لەبارەی کورد و کوردستانەوە دەڵێت: لەژێر ناونیشانی «ویلایەتی شاهانە لە کوردستاندا» تەقسیماتی ئیداری کوردستان کراوە. بەپێی ئەم تەقسیماتە کوردستان لە شەش ویلایەت و سەنجاقێکی سەربەخۆ پێکهاتووە. ویلایەتەکانی ئەرزڕووم، مەعمورەتولعەزیز (ئەلازیغ)، دیاربەکر، بەدلیس، وان، موسڵ لەگەڵ (سەنجاقی زۆر)ی سەربەخۆ. کە پێدەچێت مەبەستی لە سەنجاقی زۆر شارەزوور بێت.

لە لاپەڕە ٢٣٤-٢٣٧دا لەبارەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ژیانی کۆمەڵایەتی کوردەکانەوە دەڵێت: کوردەکان بەشێوەیەکی گشتی لە ویلایەتەکانی ئەرزڕووم، مەعمورەتولعەزیز (ئەلازیغ)، بەدلیس، دیاربەکر، وان و موسڵدا دەژین و ناوچە شاخاوییەکانیان کردووە بە نیشتمان بۆ خۆیان. کوردەکان بەکاری کشتوکاڵییەوە خەریکن. ئاژەڵەکانی وەک مەڕ، حوشتر و ئێستر بەخێو دەکەن و بە بەرهەمەکەی ژیانیانی پێ بەڕێ دەکەن. ئەو کوردانەی لە چادر و ڕەشماڵەکاندا دەژین، هەموو ساڵێک گەرمیان و کوێستان دەکەن. ئەمانە پێیان دەوترێت کۆچەری و خەریکی



کاری کشتوکاڵ نابن، واتە پەیوەست نابن بە شوێنێکی دیاریکراوەوە. هەموو سامانی کوردەکان ئاژەڵ، ئەسپ و چەک پێکهاتووە. لە دەوڵەتی عوسمانیدا ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان هەیە بە خزمەتی جیاواز توانیویانە چەندین پلەی بەرزی ئیداریی و سیاسی بگرنە دەست.

نووسەر سەبارەت بە ژنانی کورد دەڵێت: بەشێوەیەکی گشتی ژنانی کوردی شارەکان بە کاری خواردن دروستکردن، چنین و کارە دەستییەکانی دیکەوە خەریکن. ژنانی کوردی گوندەکان بە کاری مەڕدۆشین، کۆکردنەوەی مازوو و کەتیرە لە شاخەکان، بردنی ماست، پەنیر و دار بۆ شار و فرۆشتنی جا بە پارە یان بە ئاڵوگۆڕی شمەک، چنینی فەرش و بەڕە و کاری لەم شێوانە سەرقاڵن. ژنانی کورد گرنگی بە ناموسی خۆیان دەدەن. کەسانی بە قەناعەتن، بەرگەی هەموو جۆرە زەحمەتییەک دەگرن و بەهیچ جۆرێک لە قسەی هاوسەرەکانیان دەرناچن. زۆر حەزیان لە خۆدەرخستن و ڕازاندنەوە نییە. ژنانی عەشیرەتە کوردییەکان لە هاوسەرەکانیان زیاتر هەوڵدەدەن و هاوبەشی دەکەن لە یارمەتیدانی هاوسەرەکانیان بۆ بەڕێکردنی ژیان. دواتر نووسەر باس لە عەشیرەتە کوردییەکان دەکات و دەڵێت: دیارترین و زۆرترین عەشیرەت لە کوردستاندا، عەشیرەتی جافە. هەر تیرەیەک لەم عەشیرەتە سەرۆکێکی هەیە، کە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە هەڵبژێردراوە. زۆرینەی عەشیرەتی جاف موسڵمانن و مەزهەبیان شافیعییە. بەشێکیان جاهیلن و ئاگای باشیی و خراپی نازانن و حەزیان لە دزینی موڵک و ماڵی ئەوانی دیکە هەیە. چاونەترسترین تیرەی جاف ڕۆغزاییە و زمانیان کوردییە. لەهەر سەدوپەنجا کەسێکی جاف یەکێکیان خوێندەوارە، لە هەر پێنج کەسێکی خوێندەواریشیان یەک کەسیان زمانی فارسی دەزانێت. عەشیرەتی جاف لە دۆڵی دیالەدا نیشتەجێن. ئەندامی عەشیرەتەکان دەرناچن لە فەرمانی سەرۆکی عەشیرەتەکەی خۆیان، تەنانەت وەکوو کۆیلە خزمەتیان دەکەن.

**مەنەمەنلی زادە محمد تاهیر، جوگرافیای عوسمانی موکەمەل، ئیستەنبوڵ، ١٨٩٨.**

لە لاپەڕە ١٢٧دا دەڵێت: سەنجاقی شارەزوور مەرکەزی ویلایەتی موسڵە، قەبیلەکانی کورد یەکێکن لە دانیشتوانە سەرەکییەکانی ئەم سەنجاقە.

علی تۆفیق، جوگرافیای مەمالیکی عوسمانی، بەرگی سێیەم، ئیستەنبوڵ، ١٩٠٠.

لە لاپەڕە ١٨١دا دەڵێت: ئاسیای عوسمانی، خاکەکانی ئاسیای بچووک واتە ئەنادۆڵ، سووریا، جەزیرە، جەزیرەی عولیا لەگەڵ یەمەن و حیجاز لەخۆدەگرێت. لەگەڵ ئەوەی

دانیشتوانی عوسمانی لە میللەتەکانی وەک تورک، تەتەر، کورد، چەرکەز، عەرەب، لاز، ڕۆم، ئەرمەنی و یەهوودی پێکهاتووە، بەڵام هەموویان شانازی بە ژیان و پێکەوە بوونیان دەکەن لەژێر ناوی عوسمانیدا. لە لاپەڕە ٣٥٢دا لە باسی یەزیدییەکاندا دەڵێت: ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی قەزای شنگالی سەر بە سنجاقی موسڵ یەزیدین. لە لاپەڕە ٣٥٣ سەبارەت بە دانیشتوانی وان دەڵێت: ژمارەی دانیشتووانی ویلایەت نزیکەی ٣٥٠,٠٠٠ کەس دەبێت. لەم ژمارەیە یەک لەسەر سێی مسوڵمانە، ئەوی دیکەی نامسوڵمانن. بە زۆری خەڵکەکەی کوردن. لە لاپەڕە ٣٧٠ سەبارەت بە خەڵکی سێرت دەڵێت: خەڵکی سێرت بە زمانی عەرەبی و کوردی قسە دەکەن. سەبارەت بە دیاربەکر لە لاپەڕە ٣٧١ دەڵێت: ژمارەی دانیشتووانی ویلایەتی دیاربەکر بە ٤٧٠,٠٠٠ کەس دەخەملێنرێت. بەشێکی کەمی لە کوردانی کۆچەری پێکهاتووە.

**عەبدوالڕەحمان شەرەف، جوگرافیای عومومی، بەرگی یەکەم، چاپی چوارەم، چاپخانەی کاراباد، ئیستەنبوڵ، ١٩٠٥.**

لە لاپەڕە ١١٥ کاتێک باس لە ئەلایەتەکانی ئێران دەکات دەڵێت: دووەمین ئەلایەت، ئەلایەتی ئەردەڵانە یاخود کوردستان، کە مەرکەزەکەی کرمانشاهە. لە لاپەڕە ١٦٣یشدا دەڵێت: شارەزوور کە ناوەکەی دیکەی قەرەچۆلانە، شوێنێکی گرنگە بۆ قەبیلەکانی کورد. لە لاپەڕە ١٦٤یش دەڵێت: دانیشتوانی ویلایەتی وان کە زۆرینەی لە عەشیرەتە کوردییەکان پێکهاتووە، بەشێوەیەکی پەرش و بڵاو نیشتەجێ بوون. لە لاپەڕە ١٦٨ دەڵێت: ناوی کۆنی دیاربەکر ئامەدە. دووبارە لە لاپەڕە ١٦٨ دەڵێت: دەرسیم ناوچەیەکی پەرش و بڵاوە و دانیشتوانەکەی لە قەبیلە کوردەکان پێکهاتووە.

ئیبن النوزهەت جواد، نەخشەی وێنەداری جوگرافیای مەمالیکی عوسمانی،١٩١١.

لە لاپەڕە ٤ لە بابەتی کوردەکاندا دەڵێت: کوردستان بریتییە لەو کیشوەرەی کە کوردەکان بە کۆمەڵ تێیدا نیشتەجێن. کوردەکان لە نێوان بانەکانی ئێران و ئەنادۆڵ لەگەڵ دۆڵ و شیوە بەرزە دروستبووەکانی نێوان ڕووباری دیجلە و فورات نیشتەجێن و ژیانیان بە عەشائیری بەڕێ دەکەن. ئەمڕۆ ژمارەیان نزیکەی دوو ملیۆن دەبێت. لە سەردەمی فەتحەکانی عوسمانیدا توانرا بهێنرێنە ژێر ئیدارەی عوسمانی، چونکە بە مەردیەتی و جەنگاوەر ناسرابوون. هەربۆیە لە دوای شەڕی چاڵدێران بەدواوە، کوردەکان بە ڕێبەرایەتیی ئیدریسی بەدلیسی هاتنە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی. کوردەکان میللەتێکن ڕەنگیان ئەسمەرە، قژیان پڕە، چاویان بچووکە و

خاوەن جەستەیەکی تەواون. بە زمانی کوردی قسە دەکەن. کوردەکان لەبەرئەوەی چێژ لە ژیانی عەشایەری دەبەن، بەردەوام ژیانیان لەژێر چادر و شوێنە دوورە دەستەکاندا بەسەربردووە. لە لاپەڕە ٢٠ سەبارەت بەو ناوچانەی کوردەکانی لێ دەژین دەڵێت: ئاسیای عوسمانی بەپێی ئەو میللەتە جیاوازانەی لەسەری دەژین دەبن بە پێنج بەشی جوگرافییەوە: ئەنادۆڵ و ئاسیای بچووک، کوردستان و ئەرمەنستان پێکەوە، جەزیرە و عێراقی عەرەب، سووریا و فەلەستین، عەرەبستان. لە لاپەڕە ٣٤یشدا دەڵێت: بانی کوردستان تاوەکو باشووری بانی ئەرمەنستان درێژ دەبێتەوە و بەرزییەکەی ١٥٠٠ مەتر تێپەڕ نابێت. کەرەجەداغ بەرزترین زنجیرە شاخێتی. خەڵکەکەی دوو ملیۆن و نیو دەبێت و لە نەتەوە جیاوازەکانی وەک کورد، تورک، ئەرمەنی و سریانی پێکهاتووە. چوار لەسەر پێنجی دانیشتوانەکەی کوردن، ئەوی دیکەی تورک و چەرکەسی مسوڵمان و ئەرمەن و سریانی مەسیحین.

لە لاپەڕە ٣٥ لەژێر ناونیشانی کوردەکاندا دەڵێت: کوردەکان بریتین لەو نەتەوەی کە لە ئەنجامی یەکگرتنی بیانی و کاردۆخییەکان پێکهاتووە و نەتەوەکانی دیکە ڕێژەیان زیاترە لەناو کوردەکاندا. کوردەکان نەتەوەیەکی چاونەترس، جەنگاوەر و دیندار. لەگەڵ ئەوەشدا حەزیان لە قەرەباڵغی، توندوتیژیی و تالانی و دەستبەسەرداگرتنە. مەعریفەت بەپێی پێویست داخڵی ناو مەملەکەتەکەیان نەبووە. نووسەر لە بەشێکی دیکەی کتێبەکەیدا باس لە دابەشبوونی کارگێڕی دەکات و لە لاپەڕە ٣٧دا دەڵێت: بەشی کوردستان و ئەرمەنستان دابەش بووە بۆ ویلایەتەکانی ئەرزڕووم، وان، بەدلیس، دیاربەکر و مەعمورەتولعەزیز (ئەلازیغ).

**ئەبو ساڵح بەکر سدقی پیراوادی، جوگرافیای میلی، عەمەلی و نیشتمانی عوسمانی، دار سەعادەت، ١٩١٣.**

لە لاپەڕە ١٤ دەڵێت: ئەو ناوچەیەی بە کۆمەڵ کوردەکانی لێ دەژی پێی دەوترێت کوردستان. ئەمانە نەوەکانی میدیا و عەجەمن. کوردەکان دوای شەڕی چاڵدێران، لەسەر دەستی ئیدریسی بەدلیسی هاتنە ژێر ڕکێفی دەوڵەتی عوسمانی. بەشێوەی جیاواز لە شارەکانی مەملەکەتی عوسمانیدا دەستیان بە ژیان کرد. کوردەکان خوویان گرتبوو بە ژیانێکی ڕێکوپێک. حەزیان لە ژیانی عەشایەری هەیە. بەشێوازی ژیان و هەڵسوکەوتیان دەردەکەوێت چەندێک لەناو نەزانیدان. دیارە ئەم شێوازی ژیانەشیان بەهۆی نەزانییەکەیانەوەیە. ئەگەرنا لە

بنەڕەتدا بونیادی خەڵکەکەی تەواوە و کەسانی زیرەکن. وەک دەوترێت ژمارەیان ٢,٥٠٠,٠٠٠ کەسە. بەڵام هیچ گومانی تێدا نیە ئەمڕۆ ژمارەیان سێ ملیۆن دەبێت.

**محمد بەسیم، جوگرافیا لە قوتابخانە سەرەتاییەکان (کتێبی مامۆستایی)، کتێبخانەی قەناعەت، ئیستەنبوڵ، ١٩٢٨.**

لە لاپەڕە ١٢٩ لە بابەتی ناونانی شوێنەکان دەڵێت: لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵدا دوو ناوچە هەن ئەو ناوانەی لێیان نراوە زۆر نوێن. لە سەرەتادا لەژێر کاریگەری ئەورووپادا ئیمپراتۆریەتی عوسمانی قبووڵی کردبوو. تەنانەت لە کتێبەکانی خۆماندا بەم دوو ناوچەیان دەگووت کوردستان و ئەرمەنستان. تەنانەت ئێستاش لە کتێب و نەخشەکانی ئەورووپادا ناوی ئەرمینیا هەیە. ناتوانین ئەم ناوە قبووڵ بکەین، چونکە ئەمڕۆ ناتوانێت ئینکاری ڕاستییەکان بکات.

**محمد بەسیم - جمال الدین عارف، وانەکانی جوگرافیای نوێ بۆ نەوەکانی جمهورییەت، پۆلی چوارەم، ١٩٢٧-١٩٢٨.**

لە لاپەڕە ٨٠ دەڵێت: ئەمڕۆ لەم مەملەکەتەدا یەک میللەت هەیە خاوەنی یەک زمان، یەک ئایین و یەک دڵە ئەوانەش تورکەکانن. پێویست ناکات کوردەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ بە جیا بژمێرم. چونکە ئەوانیش ڕۆڵەی ئەم نیشتمانەن. ئەمانە زیاتر خەریکی کاری شوانکارین و لە دۆخی کۆچەریدان. لە لاپەڕە ١٢٠ی هەمان کتێبدا دەڵێت: لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵدا ڕێژەی شار زۆر کەمە. خەڵکی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ لە تورک و کوردەکان پێکهاتووە و زۆرینەیان گوندنشینن.

**سافڤەت، جوگرافیای تورکیای نوێ، ئیستەنبوڵ، ١٩٢٧-١٩٢٨.**

لە لاپەڕە ٥٣ دەڵێت: بەشێوەیەکی گشتی خەڵکی تورکیا لە تورکەکان پێکهاتووە. تورکەکان زۆر شەڕکەرن، قارەمانن، چاونەترسن، لە هەمان کاتدا قەناعەتکار و ئارامگرن. لە لاپەڕە ٥٤ سەبارەت بە کوردەکان دەڵێت: لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ و باکووری عێراق، جەزیرەی عولیا و ئەرزڕوومدا ژمارەیەکی زۆر کەم کورد هەیە، ژیانیان کۆچەرییە. زۆرینەی ئەمانە لە شێوەی عەشیرەتدا دەژین. لەگەڵ ئەوەی شوانکاری پیشەی سەرەکییانە، لەپاڵ ئەمەدا خەریکی کاری چنینیش دەبن.

## هەڵسەنگاندنی گشتی بابەتەکە

لەو ٢٠٠ کتێبەی کە لە ٥٠ ساڵی کۆتایی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ٥ ساڵی سەرەتای کۆماری نوێی تورکیادا نووسراوە، بە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ٣٠ کتێبیان باسی کورد و کوردستانیان کردووە. ئەو کتێب و نووسەرانەی ناوی کوردستانیان بەکارهێناوە یاخوود سەبارەت بە کوردستان زانیاریان داوە ژمارەیان ٢١ کتێبە. واتە لە سەددا ١٠ی کتێبەکانی جوگرافیا ناوی کوردستان بەکارهێناوە. ئەم ژمارەیە بە ئێمە دەڵێت، کە هەموو جوگرافیناسەکانی عوسمانی ناوی کوردستانیان وەکوو ئەلایەت و ناوچەیەک نەناساندووە. لەگەڵ ئەوەشدا جوگرافیناسەکانی عوسمانی نەیانتوانیوە بە ئاسانی ناوی کوردستان پشتگوێ بخەن. هۆی ئاسانی بەکارهێنانی ناوی کوردستان لەناو کتێبە جوگرافییەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی ئیمپراتۆریەت بووە. بە سرووشتی حاڵیش دەوڵەتە ئیمپراتۆرییەکان فرە کولتوورن. واتە هەموو جۆرە نەتەوە، ئایین و ڕەگەزێکی لەخۆگرتووە. هەربۆیە بەو ئاسانییە لەناو کتێبەکانی وانەی جوگرافیای ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا ناوی کوردستان براوە و زانیاری لەسەر دراوە. وەک چۆن هەڵەیە ئەگەر لەسەر یەک دوو کتێبی جوگرافی لێکۆڵینەوە بکرێت و وابزانرێت ناوی کوردستان زۆر بەکارهێنراوە، ئەوەش هەڵەیە بووترێت شتێک نییە بەناوی کوردستان و ئەمە تەنها پیلانێکی ڕۆژئاواییە.

دوای ئەوەی لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەم ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی ڕووبەڕووی شکستێکی زۆر بوویەوە و زۆرێک لە خاکەکانی لەدەستدا، لە زۆرینەی کتێبی وانەکانی قوتابخانەدا باس لە هاوکاریی و برایەتی و یەکێتی کراوە. لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و بەتایبەت لە سەردەمی عەبدولحەمیدی دووەم(١٨٧٦-١٩٠٩) دووبارە پەیوەندی نێوان نیشتمان و دەسەڵات هاتە ئاراوە. لە کتێبەکانی وانەی جوگرافیادا خۆشەویستی نیشتمان و خاک زیاتر جەختی لەسەر دەکرایەوە.

نووسەرانی کتێبی وانەکانی قوتابخانە زانیاری زۆر کەمیان سەبارەت بە کوردەکان هەبووە، چونکە تاوەکوو سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە هیچ جۆرە لێکۆڵینەوە و نووسراوێکی ئەوتۆ سەبارەت بە کوردەکان نییە. تەنانەت کوردەکانیش سەبارەت بە خۆیان شتێکی وایان نەدەزانی. هەربۆیە ئەو زانیارییانەی لەسەر

کوردەکان لە کتێبی وانەکانی قوتابخانەدا هەیە، زانیاری گشتیی و ڕواڵەتین. لەم ڕوانگەوە زانیارییەکانی نێو کتێبەکەی ئەحمەد ڕفاد ئەفەندی بەناوی (لوغاتی تەئریخ و جوگرافیا) و کتێبەکەی شەمسەدین سامی بە ناونیشانی (قاموسی عالەم) زانیاری گشتی و خەملێنراون. بەڵام ئەو زانیارییانەی لە کتێبەکەی عەلی سائیب بە ناونیشانی (جوگرافیای موفەسەڵ) و کتێبەکەی ئەحمەد جەمال بە ناونیشانی (جوگرافیای عوسمانی) سەبارەت بە کوردەکان دراوە زۆر گرنگن. بەتایبەت بەشێکی نووسینەکانی شەمسەدین سامی تاوەکوو ئەمڕۆش گرنگی خۆیان هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا وەک پێویست گرنگی نەدرا بە نووسینەکەی شەمسەدین سامی لەسەر کوردستان. هەربۆیە زانیارییەکانی ئەو بەپێی پێویستیش لەنێو کتێبەکانی وانەی قوتابخانەدا بوونیان نییە.

دەتوانین بڵێین سەبارەت کوردەکان نووسەرانی وەک ئەحمەد ڕفاد ئەفەندی، عەلی سائیب و ئەحمەد جەمال زۆر بەوردی و فراوانی زانیارییان خستۆتە ڕوو. لە نووسینەکانی ئەماندا لەبارەی ئەو ناوچانەی کوردەکانی لێ دەژی، ڕیشەی نەتەوەیی کوردەکان، زمانیان بە کورتی، بونیادی کۆمەڵایەتی کوردەکان، مێژووی کوردەکان و کوردە مەشهورەکان بەکورتی زانیاریان لەبارەوە خراوەتە ڕوو.

بەشێوەیەکی گشتی ئەو زانیارییانەی سەبارەت بە کوردەکان لە کتێبی وانەکانی قوتابخانە دراوە بەم شێوەیە: کوردەکان یەکێکن لە پێکهاتە سەرەکییەکانی خەڵکی عوسمانی. لە شوێنە شاخاوییەکاندا دەژین. زۆر میوان دۆستن. جەنگاوەر و چاونەترسن. لە سەردەمی یاوز سوڵتان سەلیم(١٥١٢-١٥٢٠) هاتنە ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە. لە سەردەمی عوسمانییەکاندا لە بواری سیاسیی و زانستیدا زۆر چالاک بوون. شێوەی ژیانیان عەشایەرییە. لەگەڵ ئەوەشدا لە دەرەوەی شارەکان دەژین و ژیانیان کۆچەرییە. ئەگەر لە کۆندا زۆر سەرکەوتوو بووبن، ئێستا بەهۆی بێ بەشبوونیان لە فێربوون، لە دۆخی نەزانیدان.

## سەرچاوە:

Bekir, Biçer, Osmanlıların Coğrafya Ders Kitaplarında Kürt ve Kürdistan, Medeniyet ve Toplum Dergisi, Cilt 4 l, Sayı: 1 , Yıl: 2020

